بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه اجمعين، أَمَّا بَعْدُ:

**بێگومان مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ئەو مانگەیە کە قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە؛ کە ڕێ نیشاندەری خەڵکە, وە ڕێ نیشاندەرە بۆ جیاکردنەوەی حەق لە باطل, وەك خوای گەورە دەفەرموویت:** ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ ﴾ [البقرة:١٨٥].

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی وەفاتی لە مانگی ڕەمەزاندا دوو جار خەتمی قورئانی کرد لەگەڵ جبریل عليه السلام , بۆیە گەر ئێمە لەم مانگەدا چالاك نەبین لە زۆر خوێندنەوەی قورئاندا و وردبوونەوە نەبینەوە لە ماناکانی, کەی چالاك دەبین (؟) کە لەم مانگەدا ئەو شتانەی کە ڕێگرن لە ڕۆیشتن بەرەو کاری خێر تەسك دەبنەوە, وە شەیتانەکان لەم مانگەدا بەستراونەتەوە کە شەیتان ڕێگرێکی سەختە لەسەر ڕێگای ئیمانداران بۆ گەیشتن بە کاری خێر و ئەنجامدانی عیباداتەکان, وە کات و ڕێگاکانی چوون بەرەو کاری خێر لەم مانگەدا فراوانتر دەبن و زیاتر دەبن, بۆیە حەزم کرد فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنمەوە وەك بەبیرهێنانەوەیەك بۆخۆم, پاشان بۆ ئێوەی بەڕێز؛ تا ببێتە هاندەرێك و پاڵنەرێك بۆ زیاتر خوێندنەوەی قورئان و وردبوونەوە لێی.**

**لە** (أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ) رضي الله عنه **دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:** (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ، لاَ رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ). متفق عليه, البخاري (٧٥٦٠), ومسلم (١٨١٠) واللفظ له. وفي رواية: (مثل الفاجر) بدل (المنافق). البخاري (٥٠٢٠).

**واتە:**

**- نمونەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێت، وەکو ( تورونج ) وایە، بۆنی خۆشە، و تامیشی خۆشە،**

**- وە نمونەی ئەو ئیمانداەرەی کە قورئـان نـاخوێنێت ، وەکو ( خورما ) وایە، هیچ بۆنێکی نیە، و تـامیشی بەتـامە،**

**- وە نمونەی ئەو مونـافیقەی کە قورئـان دەخوێنێت ، وەکو ( ڕێحانە ) وایە، بۆنی خۆشە، و تـامیشی تـاڵە،**

**- وە نمونەی ئەو مونـافیقەی کە قورئـان نـاخوێنێت ، وەکو ( گوژاڵك ،گوژاك ) وایە، هیچ بۆنێکی نیە ، و تـامیشی تـاڵە.**

**لە ڕیوایەتـی تـردا لە شوێنی ( منـافق )ـدا ( الفـاجر ) هـاتووە.**

**- تورونج** ( الأُتْرُجَّةِ ) **: میوەیەکە وەکو پرتـقال و لیمۆ، تـام و بۆنی خۆشە.**

**- گوژاك - گوژاڵك** ( الْحَنْظَلَةِ ) **: ڕووەکێکە بەسەر زەوی درێژ دەبێتەوە وەك شوتـی، وە بەرهەمەکەشی وەك شوتیە بەڵام زۆر بچوکە، لەلای عەرەب لەبەر تـاڵیەکەی لە زۆر بـاسدا نمونەی پـێ دەهێنرێتەوە, وەك چۆن لە کوردەواری خۆمان بۆ تـاڵی شتێك نمونە بە ژەهری مار دەهێنرێتەوە.**

ابن حجر العسقلاني **-ڕەحمەتـی خوای گەورەی لـێ بێت- دەفەرموێت:**

"قَوْلُهُ صلي الله عليه وسلم: (طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ) : قِيلَ خَصَّ صِفَةَ الْإِيمَانِ بِالطَّعْمِ وَصِفَةَ التِّلَاوَةِ بِالرِّيحِ لِأَنَّ الْإِيمَانَ أَلْزَمُ لِلْمُؤْمِنِ مِنَ الْقُرْآنِ إِذْ يُمْكِنُ حُصُولُ الْإِيمَانِ بِدُونِ الْقِرَاءَةِ وَكَذَلِكَ الطَّعْمُ أَلْزَمُ لِلْجَوْهَرِ مِنَ الرِّيحِ فَقَدْ يَذْهَبُ رِيحُ الْجَوْهَرِ وَيَبْقَى طَعْمُهُ". [ **فتح الباري** ( ٩/ ٦٦ )].

**واتە : "کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( بۆنی خۆشە، و تـامیشی خۆشە ) : دەڵێن: پێغەمبەری ﷺ سیفەتـی ئیمـانی تـایبەت کردووە بە ( تـام ) کردن، وە سیفەتـی قورئـان خوێندنیش بە ( بۆن ) کردن؛**

چونکە ئیمان واجبە و هەردەبێت لە ئیمانداردا هەبێت وەك لەوەی قورئان خوێندنی تێدابێت، ئیمان لە کەسێکدا دەبێت ئەگەر قورئان خوێنیش نەبێت، بەهەمان شێوە ( تام ) کردن پێویستە و هەردەبێت کرۆکی هەبێت لەوەی کە ( بۆن ) ی هەبێت، لەوەیە بۆنی ئەو شتە بڕوات و نەمێنێت و خواردنی هەربمێنێت".

**پاشان دەڵێت:** "ثُمَّ قِيلَ: الْحِكْمَة فِي تَخْصِيص الْأُتْرُجَّة بِالتَّمْثِيلِ دُون غَيْرهَا مِن الْفَاكِهَة الَّتِي تَجْمَع طِيب الطَّعْم وَالرِّيح كَالتُّفَّاحَةِ؛ لِأَنَّهُ يُتَدَاوَي بِقِشْرِهَا وَهُوَ مُفْرِح بِالْخَاصِّيَّةِ, وَيُسْتَخْرَج مِنْ حَبِّهَا دُهْن لَهُ مَنَافِع. وَقِيلَ: إِنَّ الْجِنّ لَا تَقْرَب الْبَيْت الَّذِي فِيهِ الْأُتْرُجّ فَنَاسَبَ أَنْ يُمَثِّلَ بِهِ الْقُرْآن الَّذِي لَا تَقْرَبهُ الشَّيَاطِين, وَغِلَاف حَبّه أَبْيَض فَيُنَاسِب قَلْب الْمُؤْمِن, وَفِيهَا أَيْضًا مِن الْمَزَايَا كِبْر جُرْمهَا وَحُسْن مَنْظَرهَا وَتَفْرِيح لَوْنهَا وَلِين مَلْمَسهَا, وَفِي أَكْلهَا مَعَ الِالْتِذَاذ طِيب نَكْهَة وَدِبَاغ مَعِدَة وَجَوْدَة هَضْم, وَلَهَا مَنَافِع أُخْرَي مَذْكُورَة فِي الْمُفْرَدَات". [**فتح الباري** (٩/ ٦٦-٦٧)].

**واتە: "پاشان دەڵێن: حیکمەت لە تایبەت کردنی تورونج** (الْأُتْرُجَّةِ) **لە پێکچواندندا بەبێ ئەو هەموو میوەجاتانەی کە هەیە کە ئەوانیش هەندێکیان تامیان خۆشە و بۆنیشیان خۆشە نموونەی وەك ( سێو )؛ لەبەرئەوەی بە توێکڵەکەی چارەسەری دەکرێت، وە خۆشی دەهێنێت بە تایبەتمەندیەکانی، وە لە دەنکەکەی چەوری دەردەهێنرێت و سوودی هەیە.**

**وە دەڵێن: جنۆکە نزیکی ماڵێك ناکەوێتەوە کە میوەی تورونجی ( الْأُتْرُجَّة ) لێ بێت، بۆیە پێکچواندنی تورونج بە کەسی قورئان خوێن پێکچواندنێکی گونجاوە و لە شوێنی خۆیەتی کە شەیاتینەکان نزیکیان نابنەوە، وە بەرگی دەنکەکەی سپیە لە بەرامبەردا دڵی ئیمانداری قورئان خوێن پاك و سپیە، وە هەروەها لەو شتانەی کە تێیدا کۆبوەتەوە گەورەییەکەیتی، وە جوانی ڕووکاری، وە کەیف خۆشبوون بە ڕەنگەکەی، وە نەرمی دەست لێدانی، وە لەگەڵ خواردنی و چێشت وەرگرتن لێی بۆن و بەرامی خۆشە، وە گەدە خۆش دەکات، هاندەرە بۆ هەرس کردن، وە سوودی تریشی زۆرە ...".**

**بۆ زیاتر زانینی سوودەکانی تورونج بگەڕێنەوە سەر کتێبی** (زاد المعاد في هدي خير العباد)، **(٤ / ٢٦٠ - ٢٦٢) ط:٢٧، مؤسسة الرسالة، ١٤١٥هـ /١٩٩٤م.**

**شێخ فيصل آل مبارك النجدي -ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت- دەڵێت:** "شَبَّهَ المؤمن القارئ بالأُتْرُجَّةِ لِما اشتملت عليه من الخواص الموجودة فيها مع حسن المنظر، وطيب الطعم، ولين المَلْمس، ويستفيد المتناول لها بعد الالتذاذ بها طيب النكهة، ودباغ المعدة، وقوة الهضم، فاشتركت فيها الحواس الأربع: الشَّمُّ، والبَصَرُ، والذَّوْقُ، واللَّمْسُ. وشَبَّهَ المؤمن غير القارئ بالتمرة لاشتماله علي الإيمان كاشتمال التمرة علي الحلاوة. وشبَّه المنافق بالرَّيْحانة لطيب تلاوته، وخبث عمله، وشبَّه المنافق الذي لا يقرأ بالحنظلة، وهي الشجرة الخبيثة.

قال الحافظ: وفي الحديث فضيلةُ حامل القرآن، وضربُ المَثَلِ للتقريب للفهم. وإن المقصود من تلاوة القرآن العمل بما دل عليه". [**تطريز رياض الصالحين** (ص٥٨١)].

**واتە:"پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمانداری قورئان خوێنی چواند بە تورونج ( الْأُتْرُجَّە ) لەبەر کۆبوونەوەی کۆمەڵێك تایبەتی کە تێیدایە، لەوانە: جوانی و قەشەنگی ڕووکار و دیمەنی، وە نەرم و صافی دەست لێدانی، وە سوودی بەردەستییشی هەیە, دوای چێشت وەرگرتن لێی بۆن و بەرامی دەم خۆشە، وە خۆشکەری گەدەیە، و یارمەتی هەرس کردن دەدات، وە هەر چوار هەستیارەکەی تێدایە:**

١- **بۆنی** ( الشَّمُّ )،

٢- **وە بینیی** ( والبَصَرُ )،

٣- **وە تام کردنی، چێشتی** ( والذَّوْقُ )،

٤- **وە دەست لێدانی** ( واللَّمْسُ ).

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمانداری قورئان نەخوێنی چواند بە ( خورما ) ؛ لەبەر یەکبوونیان لە ئیماندا، وەك تامی خۆش لەخورمادا،- واتە ئیمانداری قورئان خوێن و قورئان نەخوێن لە بوونی ئیماندا هەردووکیان ئیماندارن بۆیە لە تام کردن وەك یەکن-.**

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی موناڤقی قورئان خوێنی چواندووە بە رێحانە ؛ لەبەر باشی خوێندنی قورئاندن، و پیسی کردەوەی، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی موناڤقی قورئان نەخوێنی چواند بە ( گوژاڵك - گوژاڵ )، دارێکی پیسە.**

حافظ ( ابن حجر العسقلاني) **دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا فەزڵ و گەورەیی هەڵگری قورئانی تێدایە، وە هێنانەوەی ئەو نمونە و چواندنە بۆ زیاتر تێگەیشتنە، وە مەبەستیش لە تیلاوەی قورئان کارکردنە پێی".**

**وە** ابن عثيمين **-ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت - دەفەرمووێت:**

**"پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی هێناوەتەوە لەسەر ئیماندار و موناڤق، کەسی ئیماندار یان قورئان خوێنە وە یان قورئان نەخوێنە، ئەگەر قورئان خوێن بێت نمونەی وەکو تورونجە، واتە بەرهەمەکەی بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، ئەمە نمونەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێت" چونکە نەفسەکەی پاکە و دڵیشی پاکە، وە خێری تێدایە بۆ غەیری خۆی، دانیشتنێك لەگەڵی خێر و چاکەی تێدایە، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** ( مثل الجليس الصالح كمثل حامل المسك إما أن يبيعه أو تجد منه رائحة طيبة ).

**واتە: نمونەی دانیشتن لەگەڵ کەسی باش و صالح، وەك بۆنفرۆش وایە، یا ئەوەتا بۆنی لێ دەکرێت، وە یانیش بۆنی خۆشی لێ دەکەیت.**

**بۆیە ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێت هەموو شتێکی خێری تێدایە بۆ خۆی و بۆ غەیری خۆیشی،وەکو تورونج وایە بۆنێکی زۆر خۆشی هەیە وە تامیشی زۆر خۆشە.**

**بەڵام ئەو ئیماندارەی کە قورئان ناخوێنێتەوە وەکو ( خورما ) وایە، تامی خۆشە، بەڵام هیچ بۆنێکی نیە وەکو تورونج، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نکوڵی کرد لە بۆنەکەی؛ چونکە بۆنی خۆشی نیە، ئەگەرچی هەموو شتێك بۆنی هەیە، بەڵام بۆنیان خۆش نیە، بەڵام تامیان خۆشە، ئەمە نمونەی ئەو ئیماندارەی کەقورئان ناخوێنێتەوە.**

**کەواتە ئیمانداری قورئان زۆر گەورەتر و بە فەزڵ ترە لە ئیمانداری قورئان نەخوێن، واتە هیچ لە قورئان نەزانێت و فێرنەبووبێت.**

**وە نمونەی کەسی مونافق کە قورئان دەخوێنێت وەکو ڕێحانە وایە، بۆنێکی خۆشی هەیە، بەڵام تامی زۆر تاڵە؛ چونکە کەسی مونافق لە زاتی خۆی کەسێکی پیسە و هیچ خێرێکی تێدانیە، مونافق ئەو کەسەیە کە بە بە ئاشکرا خۆی وانیشان دەدات کە موسڵمانە، بەڵام لە دڵی کافرە و بێباوەڕە،** - والعياذ بالله-، **مونافق ئەوەیە کە خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی:** ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾ [**البقرة:٨-١٠**].

**واتە: لە ناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئیمانمان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی - قیامەت - هێناوە، لە ڕاستیدا ئیماندار نین، ئەوەی کە بەزمان دەیڵێن لە دڵیاندا نیە، بۆیە خوای گەورە بە درۆی خستنەوە.**

**ئەوانە بە گومان و خەیاڵی خۆیان خوای گەورە و ئیماندارن هەڵدەخەتێنن، هیچ کەسێك پێیان ناخەڵەتێت ئیلا نەفسی خۆیان نەبێت، بەڵام هەست ناکەن و تێناگەن و بیرناکەنەوە.**

( ١٠ ) **ئەوانە لە دڵیاندا نەخۆشی بێباوەڕی و گومان و نیفاق هەیە، خوای گەورە نەخۆشیان زیاد دەکات و سزایەکی سەختیش بۆ هەیە بە هۆی درۆکردنیان.**

**موناڤق هەیە قورئان دەخوێنێتەوە خوێندنەوەیەکی چاك بەڵام مناڤق** -والعياذ بالله- **هەروەك پێغەمبەری خوا** ﷺ **سەبارەت بە خەواریجەکان فەرموویەتی:** ( يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ ).

**واتە: قورئان دەخوێننەوە بەڵام لە قورگیان ناچێتە خوارەوە.**

**ئەوانە** -والعياذ بالله- **پێغەمبەری خوا** ﷺ **نمونەیانی هێناوەتەوە وەکو ( ڕێحانە ) ، ڕێحانە بۆنی خۆشە، ئەمە لەبەر ئەوەی هەندێك لە قورئان دەخوێننەوە، وە تامی تاڵە، ئەمەش لەبەر پیسی دەروونیان، وە خراپی مەبەستیان.**

**وە ئەو موناڤقەی کە قورئان ناخوێنێتەوە پێغەمبەری خوا** ﷺ **نمونەی هێناوەتەوە بە ( گوژاڵك - گوژاڵك ) تامی زۆر تاڵە و هیچ بۆنێکیشی نیە، ئەو ئەو موناڤیقەی کە قورئان ناخوێنێتەوە هیچ خێرێکی تێدا نیە، تامی تاڵە، وە قورئانی لەگەڵ نیە و ناخوێنتەوە کە خەڵك سوود ببینن لەو قورئانە.**

**ئەمە دابەش کردنی خەڵك بوو بە نسیبەت کتێبی خوای گەورە، بۆیە برای موسڵمان سووربە لەسەر ئەوەی کە یەکێك بێت لەو ئیماندارانەی کە قورئان دەخوێنەوە، بە شێوەیەکی حەق و ڕاست دەیخوێننەوە، تاوەکو ببیت بە یەکێك لەوانەی کە نمونەیان وەك نمونەی تورونجە، بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، والله الموفق".** [**شرح رياض الصالحين** ( ٣ / ٢١٥ - ٢١٧ )].

**بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت کە نمونەی ئیمانداری قورئان خوێن وەکو تورونجە، ئەو کەسەی کە عەمەل بەم قورئان دەکات و و عەقیدە و مەنهەجی لەم قورئان وەردەگرێت و ئیمانی پێی هەیە و هەواڵەکان بەڕاست دەخاتەوە و حەلال و حەرامی لێ وەردەگرێت، وە کاری پێدەکات، نەك تەنها موجەرەد خوێندنەوەکە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾ [سورة البقرة: ١٢١].

**واتە : خوای گەورە هەواڵمان پێ دەدات سەبارەت بەوانەی کە کتێبی پێ بەخشیون، ئەوانە ئەو کتێبە – قورئان- دەخوێنەوە خوێندنەوەیەکی ڕاست و ڕەوان، وە کاری پێ دەکەن و شوێنی دەکەون و باوەڕی پێدەهێنن، بەڵام ئەوەی بڕوای پێ ناهێنێت بێگومان ئەوانە لە زەرەرمەند و خەسارەتمەندەکانن.**

شيخ الاسلام ابن تيمية **-ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت - دەڵێت:**"وَكَذَلِكَ لَفْظُ " التِّلَاوَةِ " فَإِنَّهَا إذَا أُطْلِقَتْ فِي مِثْلِ قَوْلِهِ: ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ﴾ تَنَاوَلَتْ الْعَمَلَ بِهِ كَمَا فَسَّرَهُ بِذَلِكَ الصَّحَابَةُ وَالتَّابِعُونَ مِثْلَ ابْنِ مَسْعُودٍ وَابْنِ عَبَّاسٍ وَمُجَاهِدٍ وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ يَتَّبِعُونَهُ حَقَّ اتِّبَاعِهِ فَيُحِلُّونَ حَلَالَهُ وَيُحَرِّمُونَ حَرَامَهُ وَيَعْمَلُونَ بِمُحْكَمِهِ وَيُؤْمِنُونَ بِمُتَشَابِهِهِ. وَقِيلَ: هُوَ مِنْ التِّلَاوَةِ بِمَعْنَى الِاتِّبَاعِ كَقَوْلِهِ: ﴿وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا﴾". [**مجموع الفتاوى** (٧/ ١٦٧)].

**واتە : "هەروەها وشەی (** التِّلَاوَةِ **) بەکاردێت نمونەی وەك خوای گەورە دەفەرموویێت:** ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ﴾ **ئەوانەی عەمەلی پێ دەکەن، وەك چۆن صەحابە و تابعون وا تەفسیریان کردووە، نمونەی ابن مسعود و ابن عباس و مجاهد و جگە لەوان، دەڵێن:** ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ **شوێنی دەکەون شوێنکەوتنێکی ڕاست و ڕەوان، حەلالەکانی حەلال دەکەن، وە حەرامەکانی حەرام دەکەن، وە عەمەل بە ئایاتی موحکەم دەکەن، وە ئیمانیان بە موتەشابیهەکان دەهێنن, وە دەڵێن: تیلاوە بە مانای شوێنکەوتن دێت, وەك خوای گەورە دەفەرموویێت:** ﴿وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا﴾ **واتە: سوێند بە مانگ کاتێك بە شوێنی دادێت".**

**وە خوای گەورە دەفەرموویێت:**

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَنْ تَبُورَ (٢٩) لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ [**فاطر:٢٩-٣٠**].

**واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کتابی خودا -قورئان- دەخوێننەوە: واتە شوێنی فەرمانەکانی دەکەون، و واز لەوانە دەهێنن کە نەهی لێکراوە، بەڕاستی دەخەنەوە و عەقیدەی لێ وەردەگرن، وە هیچ قسەیەك پێشی ئەو قورئانە ناخەن کە پێچەونەی بێت، وە هەروەها ئەلفاقەکان دەخوێنن و ماناکانی تێدەگەن، وە بە وردبوونەوە و تدبر و شوێنکەوتنی شتی لێدەردهێنن.**

**وە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجامداوە و لە ماڵ و سامانەی پێیان بەخشراوە، بە نهێنی و ئاشکرا دەیبەخشن لە پێناوی خودا، وە ئەو کارەیشی کە دەیکەن هەرگیز لێی بێ ئومێد نابن و پەشیمان نابنەوە لێی.**

( ٣٠ ) **پاشان ڕەجایان وایە کە خوای گەورە پاداشت بداتەوە ، خوای گەورە فەزڵیان زیاد دەکات، و بەڕاستی ئەو خوایە لێخۆشبوو و سوپاسگوزارە. [بڕوانە: تیسیر الکریم الرحمن (ص: ٦٨٩)].**

ابن عثيمين -**ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت- دەڵێت:**"تِلاوةُ كتَابِ اللهِ عَلَي نوعين: تلاوةٌ حكميَّةٌ: وهي تَصْدِيقُ أخبارِهِ وتَنْفيذُ أحْكَامِهِ بِفِعْلِ أوامِرِهِ واجتناب نواهيه. والنوعُ الثاني: تلاوة لفظيَّةٌ: وهي قراءتُه". [**مجالس شهر رمضان (ص٣٣-٣٤)**].

**واتە: خوێندنەوەی قورئان دەبێت بە دوو جۆر:**

١- تلاوةٌ حكميَّةٌ: **بریتی یە لە بەڕاستدانانی هەواڵەکانی و جێبەجێ کردنی ئەحکامەکانی بە ئەنجامدانی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی.**

٢- تلاوة لفظيَّةٌ: **بریتی یە لە خوێندنەوەی قورئان.**

**بۆیە زانایان ئاگادارمان دەکەنەوە لەوەی کە قورئان نەنێردراوە تەنها بۆ خوێندنەوە و بەس، وە یان بەس بۆ بەرەکەت بخوێندرێتەوە، نا، بەڵکو دەخوێندرێتەوە بۆ وەرگرتنی عەقیدە و مەنهەج لێی، وە بە ڕاست دانانی هەواڵەکانی و کارکردن پێی.**

فضيل بن عياض -**ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت- دەفەرمووێت:**"إِنَّمَا نَزَلَ الْقُرْآنُ لِيُعْمَلَ بِهِ ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ قِرَاءَتَهُ عَمْلاً ، أَي لِيُحِلُّوا حَلالَهُ ، وَيُحَرِّمُوا حَرَامَهُ ، وَيَقِفُوا عِنْدَ مُتْشَابِهِهِ". [**أخلاق حملة القرآن للآجري** (**ص:٤١**)].

**واتە: بەڕاستی قورئان دابەزیوە بۆ ئەوەی عەمەلی پێ بکرێت، بۆیە خەڵکی قورئان دەخوێننەوە عەمەلی پێ دەکەن، واتە: حەلالەکانی حەلال بکەن، وە حەڕامەکان حەڕام بکەن، وە لە متشابهەکان بوەستن.**

**وە** محمد بن الحسين الآجُرِّيِّ -**ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت- لە دوای ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت:**

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴾. [**النساء: ٨٢**].

**دەفەرمووێت:**"أَلا تَرَوْنَ رَحِمَكُمْ اللهُ إِلَي مَوْلاكُمْ الْكَرِيْمِ ؛ كَيْفَ يَحُثُّ خَلْقَهَ عَلَي أَنْ يَتَدَبَّرُوا كَلامَهُ ، وَمَنْ تَدَبَّرَ كَلامَهُ عَرَفَ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ ، وَعَرَفَ عَظِيمَ سُلْطَانِهِ وَقُدْرَتِهِ ، وَعَرَفَ عَظِيمَ تَفَضُّلِهُ عَلَي الْمُؤمِنِينَ ، وَعَرَفَ مَا عَلَيْهِ مِنْ فَرْضِ عِبَادَتِهِ ، فَأَلْزَمَ نَفْسَهُ الْوَاجِبَ ، فَحَذِرَ مِمَّا حَذَّرَهُ مَوْلاهُ الْكَرِيْمُ ، وَرَغِبَ فِيمَا رَغَّبَهُ فِيهِ ، وَمَنْ كَانَتْ هَذِهِ صِفَتُهُ عِنْدَ تِلاوَتِهِ لِلْقُرْآنِ ، وَعِنْدَ اسْتِمَاعِهِ مِنْ غَيْرِهِ ، كَانَ الْقُرْآنُ لَهُ شِفَاءً ، فَاسْتَغْنَي بِلا مَالٍ ، وَعَزَّ بِلا عَشِيرَةٍ ، وأَنِسَ بِمَا يَسْتَوحِشُ مِنْهُ غَيْرُهُ ، وَكَانَ هَمُّهُ عِنْدَ تِلاوَةِ السُّورَةِ إِذَا افْتَتَحَهَا : مَتَّي أَتَّعِظُ بِمَا أَتْلُوهُ ؟ ، وَلَمْ يَكُنْ مُرَادُهُ مَتَّي أَخْتِمُ السُّورَةَ؟، وَإِنَّمَا مُرَادُهُ : مَتَّي أَعْقِلُ عَنْ اللهِ الْخِطَابَ ؟ ، مَتَّي أَزْدَجِرُ ؟ ، مَتَّي أَعْتَبِرُ ؟ ، لأَنَّ تِلاوَتَهُ لِلْقُرْآنِ عِبَادَةٌ ، وَالْعِبَادَةُ لا تَكُونُ بِغَفْلَةٍ ، وَاللهُ الْمُوَفِّقُ". [**أخلاق حملة القرآن** (**ص ٣**)].

**واتە: سەیر ناکەن - ڕەحمەتی خواتان لێ بێت- ؛ چۆن خوای گەورە هانی دروستکراوەکانی دەدات لەسەر تێڕامان و بیرکردنەوە لە قسەکانی، وە هەرکەسێك بیربکاتەوە و وردبێتەوە و تدبر بکات لە قسەکانی خوای گەورە دەناسێت، وە گەورەیی فەرمانڕەوایی و توانای خوای گەورە دەزانێت، وە گەورەیی میهرەبانی خوای گەورە دەزانێت بەسەر ئیمانداران، وە ئەوە فێردەبێت کە خوای گەورە واجبی کردووە لەسەریان لە عیبادەتەکان، وە نەفسی خۆی پەیوەست دەکات بەو واجبانە، وە ئاگادار و وریا دەبێت لەوانەی کە خوای گەورە ئاگادار کردنەوەی داوە لێی، وە حەزی لەو شتە دەبێت کە خوای گەورە ویستی لێیە و پێی ڕازیە،**

**وە هەرکەسێك ئەمە سیفەتی دەبێت لەکانی خوێندنەوەی بۆ قورئان، وە لەکاتی بیستنی قورئان لە غەیری خۆی، ئەوا ئەو قورئانەی بۆی بووەتە شیفا، بەبێ ماڵ و سامان دەوڵەمەندبووە، وە بەبێ بوونی عەشیرەت بەهێز بووە، وە ژیر و دڵخۆش دەبێت بەرامبەر بەو شتەی کە غەیری خۆی لێی تۆقیون و ترساون، وە کاتێك دەست دەکات بە خوێندنەوەی سوڕەتێك خەم و پەژارەی ئەوە دەبێت کە :** « مَتَّي أَتَّعِظُ بِمَا أَتْلُوهُ ؟ »،

**ئایا کەی پەند وەردەگرم لەوەی کە دەخوێنمەوە** ( ؟! )، **مەبەستی ئەوە نابێت کە کەی ئەم سوڕەتە تەواو دەکەم**( ! )، **بەڵکو مەبەستی ئەوەیە :** « مَتَّي أَعْقِلُ عَنْ اللهِ الْخِطَابَ ؟ ، مَتَّي أَزْدَجِرُ ؟ ، مَتَّي أَعْتَبِرُ ؟ »

**کەی ژیر و ئاقڵ دەبم لە پەیامی خوای گەورە** ( ؟ )، **وە کەی واز دێنم لەوەی کە قەدەغە کراوە لێم** ( ؟ )، **وە کەی پەند و ئامۆژگاری وەردەگرم لێی** ( ؟! )" **چونکە خوێندنەوەی قورئان عیبادەتە، وە ناکرێت بەبێ ئاگایی عیبادەتی خوای گەورە بکەی،** وَاللهُ الْمُوَفِّقُ".

**وە** شيخ الإسلام ابن تيمية **-ڕەحمەتی خوای گەورە لێ بێت- دەفەرموێت:**" وَالْمَطْلُوبُ مِنْ الْقُرْآنِ هُوَ فَهْمُ مَعَانِيهِ وَالْعَمَلُ بِهِ ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ هَذِهِ هِمَّةَ حَافِظِهِ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالدِّينِ".[**مجموع الفتاوى ( ٢٣ / ٥٥ )**].

**واتە: ئەوەی کە داواکراوە لێمان بەرامبەر بە قورئان ئەوەیە کە لە ماناکانی تێبگەین و کاری پێ بکەین، ئەگەر ئەمە ویستی ئەو کەسە نەبێت کە لەبەری دەکات ئەوە کەسێك نیە لە ئەهلی عیلم و دین.**

**وە شێخ** ربيع بن هادي المدخلي **- خوای گەورە بیپارێزێت - دەڵێت:**"وأنت حينما تقرأ القرآن لا تقرأ للبركة يا أخي اقرأ لتعتقد وتعمل، اقرأ القرآن لتعتقد وتعمل؛ لأنَّ أصحاب مُحَّد -ﷺ- كانوا هكذا، ولهذا كان ينزل عليهم القرآن منجَّمًا، ويعلِّمهم الرسول -ﷺ- عشر آيات، عشر آيات يحفظون ويعملون ويعتقدون، هكذا تكون التربية.

الآن الواحد يقرأ القرآن إلي آخره لكن لا يدري ما معناه، لا فهمًا ولا فقهًا، وقد يفقه ولا يعمل.

القرآن يحتاج إلي فقه، ويحتاج إلي تطبيق، يحتاج إلي عمل، والله ما ضرَّنا إلا الادِّعاءات الفارغة، وكثرة الثَّرثرة، والكلام الفارغ، وكثيرٌ منا يتحدَّث عن التَّقوي والله أعلم بحاله؛ فيجب يا أخوة أن تطابق أقوالنا أفعالنا، ولا يكون ذلك إلا بالإخلاص لله–تبارك وتعالي– في كلِّ قولٍ وعمل، ومراقبة الله – عزَّ وجل – في كلِّ حال من الأحوال، في صلاتك وفي دكانك، في مسجدك، في مدرستك، في سيارتك، في أيِّ مكان تكون يجب أن تري أنَّ عليك ربًا رقيبًا شهيدًا وكيلًا، يعلمُ خلجاتَ نفسِك، وما تتحرَّك بهِ شفتُك، وما تُحدِّثُ به نفسَكَ. ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُۥ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴾". [**المجموع الرائق من الوصايا والزهديات والرقائق** (ص٢٤)].

**واتە: تۆ کاتێك قورئان دەخوێنیتەوە تەنها بۆ بەرەکەت مەیخوێنەوە، براکەم قورئان بخوێنەوە بۆ ئەوەی عەقیدەتی لیّ وەرگریت و عەمەلی پیّ بکەیت.**

**بخوێنەوە بۆ عەقیدە وەرگردن لێی و عەمەل کردن پێی؛ چونکە صەحابە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوون، هەربۆیە ئاوا قورئان بە شێوەی پچڕ پچڕ دابەزی بەسەریان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دە ئایات دە ئایات فێری دەکردن، لەبەریان دەکرد و کاریان پێی دەکرد و عەقیدەیان وەردەگرت لێی، پەروەردەکردن بەمشێوەیە.**

**ئێستا یەکێك قورئان دەخوێنێت تا کۆتایی بەڵام هیچ لە ماناکەی نازانێت، وە هیچ لێی تێناگات ، لەوەشە لێی تیّ بگات ، بەڵام کاری پیّ ناکات.**

**بۆیە قورئانی پیرۆزی پێویستی بە تێگەیشتنە لێی، وە پێویستی بە جێبەجێکردنیەتی، پێویستی بەوەیە کە کاری پیّ بکرێت، واللە هیچ سودێك ناگەیەنێت تەنها بانگەشەی بەتاڵ و ناوبۆشە، وە زۆر قسە کردن و وتن وتنە، و قسەی ناوبۆشە.**

**بۆیە زۆرێکمان قسە دەکەین و باسی تەقوا دەکەین، خوای گەورە عالمە بەحاڵی؛ بۆیە پێویستە برایان قسەکانمان و کردەوەکانمان وەك یەك بن، وە ئەمە نایەتە دی ئیلا بەوە نەبێت کە تەنها مەبەست و ئیخلاصمان بۆ خوای گەورە بێت لە هەموو قسەیەك و کردەوەیەکدا، وە بەردەوام هەست بە موراقەبەی**

**خودا بکەین لە هەموو حاڵەتێك لە حاڵەتەکاندا، چی لە نوێژەکانتدا، وە یاخود لە دوعاکانتدات، لە مزگەوتدا، لە قوتابخانەدا، لەناو ئوتومبێلدا، لە هەرشوێنێك کە لێی بیت، پێویستە بیروباوەڕوت وابێت کە خودایەك هەیە، پەروەردگارێك هەیە ڕەقیب و چاودێرە بەسەرتەوە، وە ئامادەیە - بەعیلمی خۆی-، و وەکیلە، زانایە بە بزوانی نەفست** ( يعلمُ خلجاتَ نفسِك)**، وە زانایە بەوەی کە لێوەکانتی پێ دەجولێنی ، وە زانایە بەوەی کە لە نەفستدا قسە دەکەیت و بیردەکەیتەوە،** ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُۥ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴾. [ ق: ١٦] .

**وە هەروەها دەڵێت -خوای گەورە بیپارێزێت- :**"والله لو تلونا هذا القرآن حقّ تلاوته و اتّبعنا ما فيه،لسعدنا في هذه الدنيا،و لسعدنا في الآخرة". [ **المجموع الرائق ( ص١٢٨ )**].

**واتە : سوێند بەخوا - والله - ئەگەر قورئان بخوێنینەوە بە شێوەیەکی ڕاست وڕەوان ، وعەمەلی پێ بکەین و شوێن ئەوە بکەوین کە تێیدایە ، خۆشبەختی دونیا و ئاخیرەت دەبین.**

**وە هەروەها دەڵێت -خوای گەورە بیپارێزێت- :**"والله لا قيمة للفقه ولا لغيره؛ إذا ضيعنا العقيدة وضيعنا التوحيد، ووقعنا في الشرك بالله؛ لا فائدة لأي علم أبداً !! ولو حفظنا القرآن، وحفظنا الحديث، وحفظنا كتب الفقه، ونحن واقعون في ظلمات الشرك، لا قيمة لنا ولن نستفيد من هذا العلم". [**مرحباً يا طالب العلم ( ص١١١ )** ].

**واتە : سوێند بەخوا - والله – فیقهـ و علمی تر هیچ قیمەتێکیان نیە؛ ئەگەر عەقیدەمان لە کیس چوو، تەوحیدمان لە کیس چوو، وە کەوتینە ناو شیرك و هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە؛ هیچ سوودێکی نیە، هەر علمێك بێت هیچ سودێکی نابێت هەرگیز ( !! )، ئەگەر هەموو قورئان لەبەر بکەین، وە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ لەبەر بکەین، وە کتێبی فیقهی لەبەر بکەین، وە ئێمەش کەوتبینە ناو تاریکایی شیرکەوە، هیچ قیمەتێکی بۆمان نیە، وە هیچ سودێکمان لەو علمە وەرنەگرتووە.**

**لە کۆتایدا:**

**پێویستە لەسەرمان کە هەوڵ بدەین بەمشێوەیە بین کە خوای گەورە وەصفی ئیمانداران دەکات, وە بەمشێوەیە بین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی ئیمانداری قورئان خوێنی پێ دەهێنێتەوە, کە خواردنی تورونەجە, کە تامی خۆشە, بەهەمان شێوە کەسی قورئان خوێن دەبێت سوود لەو قورئان خوێندنە وەربگرێت, بە قورئان خوێندنەوە ئیمانی زیاد بکات, وە کاری پێ بکات, عەقیدەی لێ فێرببێت, وە هەروەها تورونج بۆنی خۆشە, بەهەمان شێوە کەسی قورئان خوێن دەبێت سوودی بۆ خۆی و غەیری خۆیشی هەبێت, خەڵکی فێرە عەقیدە و مەنهەجێکی ڕاست و دروست بکات, وە هەروەها تورونج ڕوکارێکی جوانی هەیە ئەو کەسەی کە دەیبینێت دڵی خۆش دەبێت, بەهەمان شێوە کەسی قورئان خوێن دەبێت خاوەن هەیبەت و ڕووکارێکی جوان وپاك بێت, کاتێك خەڵکی دەیبینن دڵخۆش بن بە بینینی, وە هیوا بخوازن کە بەردەوام لەگەڵی بن لەبەر زۆری سود بینین لەگەڵی, وە هەروەها تورونج دەست لێدانی نەرم و خۆشە, بەهەمان شێوە کەسی قورئان خوێن پێویستە کە خاوەن ئاداب و خوڕەوشتێکی جوان بێت, وە کەسێکی دانا و هۆشمەند بێت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکیدا, وە دانا بێت لە بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ کاری خێر, والله تعالى أعلم.**

**خوای گەورە لەم کەسانەمان بکات کە قورئان خوێنێکی شوێنکەوتە بین.**

و صلى الله على نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين

**مسعود رمضان**

**٨ رمضان ١٤٣٨ هـ**